تقبل الله

مِنّا وَمِنكم صالحَ الأعمال

# ئەحکامێن جەژنێ و سونەتێن وێ



نڤیسینا

محمد بن صالح العثيمين

رحمه الله تعالى

وەرگێران

بابێ عبدالله یێ بەرواری

**پەرتۆك** : أحكام العيد وسننه

**نڤێسینا** : الشيخ الفقه: محمدبن صالح العثيمين(رحمه الله)

**وەرگێرانا** : بابێ عبدالله هوار بەرواری

**ناڤێ پەرتۆكێ بكوردی : ئەحكامێن جەژنێ و سونەتێن وێ**

**ژمارا سپاردنێ** : ...............

**سالا چاپكرنێ** : 1441ك – 2020 ز

## پێشەكیا وەرگێری

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا ، من يهد الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

**ژبەر گرنگی یا ڤی بابەتی گەلەك رابین ئەڤ بابەتە كرن نامەكا سەربەخۆە و بلاڤ كرن ، دبنیات دا ئەڤ بابەتە یا د مجموع فتاوى ورسائل فضيلة الشيخ محمد بن صالح العثيمين (16/216–225) دا هەیی ، و هەر ژ بەر گرنگی یا وێ ئەم رابین ب وەرگێرانا ڤێ ناما بچیك یا كۆ مروڤ تێدا فێری ئەحكام و سونەتێن جەژنێ دبیت ل سەر وی شێوازێ خوەشتڤی یێ مە پێغەمبەرێ خودێ ( صلى الله عليه وسلم ) ل سەر ، و هەروەسا مروڤ تێدا فێری وان تشتا دبیت ئەو تشتێن دژی رێك و رێبازا راست ، و ل دویماهییێ دوعا ژ خودێ دكم خودێ بكەت میزانیا خێرین شێخێ هێژا شێخ محمد بن صالح العثيمين ی و مە ژی ل خێر و باشیا وێ بێ بەهر نەكەت و فی كاری خالص بخوە بهژمێریت ، و هەروەسا هیڤی ژ خودێ دكەم هەمی موسلمان ژی ژخیر و باشیا وێ بێ بەهر نەبن.**

پرسيار/ ئەحكامێن جەژنێ چنە؟ وئەو چ سونەتن د وێ ڕۆژێ دا هەين؟

شێخی بەرسڤ دا ب گوتنا خۆە: خودێ گەلەك ئەحكامێن جورا و جور يێن داناين د ڕۆژا جەژنێ دا ، ژوانا :

1.يا سونەتە تەكبير دان د شەڤا جەژنێ دا ل دەمێ ئاڤا بۆنا ڕۆژێ ژ ڕۆژا دويماهيكێ ل ڕەمەزانێ هەتا پێش نڤێژ(ئيمام) ئامادە دبيت د جهێ نڤێژا جەژنێ دا ، و شێواز و سەروبەرێ تەكبيرا (هوساييە) : الله أكبر الله أكبر، لا إله إلا الله، الله أكبر، الله أكبر ولله الحمد. يان دێ سێ جارا بێژيت : الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله، الله أكبر، الله أكبر، ولله الحمد. ئەڤە هەمی دڕوستن.

ويا پێدڤی يە مروڤ دەنگێ خۆە ب ڤی زكری بلند بكەت د سيك و مزگەفتان و مالان دا ، و ژن دەنگێ خۆە ب ڤێ چەندێ بلند ناكەن.

2. خوارنا قەسپان ب كت (بخوت) بەری دەركەتنا بۆ جەژنێ ، چنكو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژا جەژنا ڕەمەزانێ نە دەركەت هەتا هندەك قەسپ كۆ ببان كت [1] خواربان ، كۆ ئەو بەس بكەت ل سەر كتا هەر وەكی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) وە كری.

3. باشترین جلك بكەتە بەرخۆ ، و ئەڤ چەندە بۆ زەلامانە ، بەلێ پا ژن نابیت جلكێ جوان بكەتە بەر خۆ ل دەمێ دەردكەفیت بۆ جهێ نڤێژا جەژنێ ژبەر گوتنا پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم): «وليخرجن تَفِلات» ڕامان : ((بلا ئەو بجلكێن ئاسایی و بێی كۆ بێهنێت خۆەش لێ بهێن )) جلكێ ئاساینە نە كۆجلكێ بێ ستارە ، و یا حەرامە ل سەر وێ ئەو بێ ستارەی و ب بێهن خۆەشی دەركەفیت .

1 : ئێك یان سێ یان پێنج

4. وهندەك زانايا يا كرى سونەت كۆ مروڤ سەرێ خوە بشۆت بۆ نڤێژا جەژنێ ، چونكو ئەڤ چەندە ياش هندەك سەلەفا(صحابى و تابعى و تابعێن تابعا) هاتى ڤەگوهازتن ، و خوە شيشتن بۆ جەژنێ سونەتە ، هەروەكى بۆ رۆژا ئەينيێ هاتيە دانان ژبەر كوم بينا خەلكى ، ئەگەر مروڤ خوە بشوت دا ئەڤ چەندە گەلەك باشتر بيت .

4. نڤێژا جەژنێ : بێ گومان موسلمان هەمى ئێك دەنگن ل سەر دروستيا نڤێژا جەژنێ ، و هندەك ژ وان دبێژن : سونەتە ، و هندەك ژ وان دبێژن : فەرزو كيفايەتە ، و هندەك ژ وان دبێژن : فەرزو عەينە هەر كەسەكێ نەكەت يێ گونەهكارە ، چنكو بخوە گوتنا پێغەمبەرى (صلى الله عليه وسلم) دكەن بەلگە هەتا فەرمان ل وان كچێن بالغ ئەوێن ب ستارە د مال دا كر و وان ژنێن نە د حەيزێ دا كۆ ئەو ئامادەبن ل جهێ نڤێژا جەژنێ ، ئيللا هندى ئەوێن دكەفن حەيزا دا ئەو خوە دوير بكەن ژ جهێ نڤێژا جەژنێ ، چنكو يا د حەزێ دا ناجێبيت بمينيت د

مزگەفتێ ڤە ، خۆە ئەگەر دڕوست ژی بیت كۆ ئەو ل مزگەفتێ را ببوریت بەلێ

نابیت بمینیت تێدا .

و ئەوا ل نك من یا راست و دڕوست ژ بەلگان كۆ ئەو فەرز و عەینە[2] ، ئەو یا

واجبە ل سەر هەر زەلامەكی كۆ ئەو ئامادەی نڤێژا جەژنێ ببیت ئیللا ئەو تێ

نەبیت عوزرەك هەبیت ، و ئەڤە هەلبژارتنا شێخ ئیسلام ابن تیمیە ، و ئەگەر ژ

دەست مروڤی چوو ل سەر رادبیت چنكو وەكی نڤێژا ئەینێ یە ، نڤێژا ئەینیێ

ئەگەر ژ دەست مروڤی چوو ل سەر رادبیت ، ئەگەر دەم دەمێ گوتارا ئەینیێ بیت

دا بێژین وی كەسێ گوتارا ئەینیی ژ دەست دای نڤێژا نیڤرۆ نەكەت[3] ، بەلێ

دەمێ نڤێژا وی یا ئەینیێ ژ دەست چوو بیت واجبە نڤێژا نیڤرۆ بكەت ، چنكو

---

2 : ل سەر هەمی موسلمانا فەرز و عەینە كرنا نڤێژا جەژنێ یێ نەكەت گونەهـ كارە

3 : ئەگەر ل دەمێ ئەینیێ دا نڤێژا ئەینیێ ژ دەست بچیت نابیت نڤێژا نیڤرۆ بكەت چنكو ل دەمێ ئەینیێ دایە

دەمێ نڤێژا نیڤرۆی یە ، بەلێ نڤێژا جەژنێ وێ چ نڤێژێن فەرز نینن ژبلی نڤێژا جەژنێ نەبیت دەمێ ژ دەست دچیت [4] .

بەلێ بۆچونا هندەك زانایان وەساییە كۆ سونەتە نڤێژا جەژنێ بهێتە قەزا كرن،

ڤێجا ئەگەر هاتی (بۆ) نڤێژا جەژنێ و ئیمام یێ گوتارێ د خوینیت ، دێ نڤێژا جەژنێ ل سەر وی شێوازێ ئیمامی كری كەی ، و دێ د ركعەتا ئێكێ دا سورەتا {سبح اسم ربك الأعلى} خوینیت ، و د ركعەتا دوویێ دا سورەتا {هل أتاك حديث الغاشية} خوینیت ، یان سورەتا (ق) د ركعەتا ئێكێ دا خوینیت ، وسورەتا (قمر) د ركعەتا دوویێ دا خوینیت ، وهەردوو شێواز حەدیسێن ڕاست یێن پێ هاتی ژ پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) .

---

4 : ئەگەر نڤێژا جەژنێ ژ دەست مروڤی چوو چ دەم نین تو تێدا بكەی ئەو دەمە نەبیت ئەو دەمێ نڤێژا جەژنێ تێدا دهێتە كرن.

6. ئەگەر ئەینی و جەژن کەتە د ئێك ڕۆژێ دا ، دێ نڤێژا جەژنێ هێتە کرنێ و هەر وەسا دێ نڤێژا ئەینیێ ژی هێتە کرنێ ، هەروەکی دبیت بەلگە ل سەر سەرڤەیا حەدیسا یا نوعمانێ کورێ بەشیری ئەوا کو ئیمام موسلمی د صەحیحا خۆە دا ڤەگوهاستی ، بەلێ هەر کەسەکێ ئامادە بیت ل گەل ئیمامی ل نڤێژا جەژنێ دا ئەگەر بڤێت بلا ل گوتارا ئەینیێ ئامادە بیت ، و ئەگەر بڤێت بلا نڤێژا نیڤرۆ بکەت .[5]



7. و ژ ئەحکامێن نڤێژا جەژنێ یە کۆ ئەو ل نك گەل زانایان ئەگەر مروڤ هات بۆ جهێ نڤێژا جەژنێ بەری ئامادە بوونا ئیمامی ئەو دێ روینیت خوار و دوو رکاعەت سونەت ناکەت ، چنکو پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) نڤێژا جەژنێ دوو رکاعەت کرن و چ سونەت نە ل بەری وێ و نە ل پشتی وێ نەدکرن.

بەلێ بۆچونا هندەك زانایان وەساییە کۆ ئەگەر مروڤ هات (جهێ نڤێژا جەژنێ) بلا نە روینیت خوار هەتا دوو رکعەت سونەت بکەت ، چنکو جهێ نڤێژا جەژنێ مزگەفتە ،

---

5 : ئەگەر ڕۆژا ئەینیێ و جەژنێ کەتە دئێك ڕۆژێ دا ، و ئەگەر مروڤ ئامادەی نڤێژا جەژنێ بی ، دروستە نڤێژا خۆە یا نیڤرۆ ل مال بکەت و دروستە ژی بچیتە خوتبێ ، بکەیفا خۆەیە.



ب دەليلێ كۆ يا د حەيزێ دا بيت يا هاتى پاشڤه لێ دان ژ جهێ نڤێژا جەژنێ ، ڤێجا بۆ جهێ نڤێژا جەژنێ خۆجه دبيت حوكمێ مزگەفتێ ، ڤێجا ئەڤه بەلگه و دەليله كۆ ئەو مزگەفته ، ئەگەر نه مزگەفت با ئەحكامێن مزگەفتێ بۆ خۆجه نەدبين ،

و ل سەر ڤێ چەندێ (ئەڤ چەنده) دچيته بن گوتنا پێغەمبەرى يا گشتى (صلى الله عليه وسلم) : «إذا دخل أحدكم المسجد فلا يجلس حتى يصلي ركعتين» .

ڕامان (( ئەگەر ئێك ژ هەوه هات دمزگەفتێ ڤه بلا نه روينيت خوار هەتا دوو ركعەت سونەت بكەت)) .

ڤێجا سەبارەت نەكرنا سونەتێن پێغەمبەرى (صلى الله عليه وسلم) بەرى وێ و پشتى وێ ئەڤه ژبەر هندێ بى ئەگەر ئاماده ببا دا دەست ب نڤێژا جەژنێ كەن .

ژبەر هندێ خۆجه دبيت بۆ جهێ نڤێژا جەژنێ سونەتا چوونا دمزگەفتێ ڤه سلاڤا مزگەفتێ (تحيه المسجد) هەر وەكى خۆجه دبيت بۆ هەمى مزگەفتان ، ڤێجا ئەگەر مه ئەو حەديسەگرت و كره بەلگه كۆ مزگەفتا جەژنێ چ سونەت نين دا بێژين : بۆ

مزگەفتا خوتبێ ژی چ سونەت نینن چنكو پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دەمێ ئامادەی مزگەفتا ئەینیێ ببا دا گوتارێ خوینیت پاشی دا دوو ركعەتا كەت ، پاشی دا چیت و دا سونەتێن خوتبێ ل مال كەت ، و چ سونەت نەل پشتی وێ و نە ل بەری وێ نەدكرن (د مزگەفتێ ڤە) .

و ئەوا ڕاست و دروست ل نك من مزگەفتا جەژنێ دێ دوو ركعەت سونەت سلاڤا مزگەفتێ كەی (تحية المسجد) ، و ل گەل ڤێ چەندێ هندەك ژ مە نەكەتە كێماسیی بۆ هندەكا ل سەر ڤی بابەتی.

چنكو بابەتەكە زانا یێن جیاواز بین تێدا و چێنا بیت بكەینە كێماسی هندەك ژ مە بۆ هندەكا ل وان بابەتێن جیاوازی تێدا هەین ئیللا ئەگەر دەلیل و بەلگەكێ گەلەك ئاشكرا و دیار هەبیت ، ڤێجا هەر كەسەكێ سونەتێ بكەت(یا جەژنێ) ئەم ئینكار و كێماسیێ ل سەر وی ناكەین ، و یێ روینیت و نەكەت ئەم ئینكار و كێماسیێ ل سەر وی ژی ناكەین .



8. ژ ئەحکامێن رۆژا جەژنا رەمەزانێ یە کۆ زەکاتا سەر فترا تێدا فەرز دبیت ، بێ گومان پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) یێ ئەمر کری کۆ بەری نڤێژا جەژنێ بدەیی(زەکاتا سەر فترا ) ، و هەروەسا دروستە بەری ڤێ (جەژنێ) ب رۆژەکێ یان ب دوو رۆژا بدەیی ژبەر گوتنا عبداللە یێ کورێ عومەری (ئەوا) د صەحیحا بوخاری دا (خودێ ژ وی و بابێ وی رازی بیت ) «وكانوا يعطون قبل الفطر بيوم أو يومين»

راماں (( وانا زەکاتا سەر فترا ددان بەری جەژنا رەمەزانێ ب رۆژەکێ یان ب دوو رۆژان )) .

و ئەگەر پشتی نڤێژا جەژنێ دا جهێ زەکاتا سەر فترێ ناگریت ژبەر حەدیسا عبداللە یێ کورێ عەباسی (خودێ ژ وی و بابێ وی رازی بیت ) «من أداها قبل الصلاة فهي زكاة مقبولة، ومن أداها بعد الصلاة فهي صدقة من الصدقات»

ڕامان (( هەر كەسەكێ بەری نڤێژا جەژنێ بددەت ئەڤە ئەو زەكاتە یا قەبیلە ، و هەر كەسەكێ پشتی نڤێژا جەژنێ بددەت ئەڤە خێرەكە ژ خێرا (خێرەك ئاساییە نابیت زەكاتا سەر فیترا)) .

ڤێجا یا حەرامە ل سەر مروڤی كۆ ئەو زەكاتا سەر فترێ گیرۆ بكەت ژ نڤێژا جەژنێ ، ڤێجا ئەگەر گیرۆ كر بێ عوزر ئەڤە زەكاتەكە ناهێتە قەبیل كرنێ ، ئەگەر یێ خودان عوزر بیت وەكی یێ د سەفەرێ دا و چ ل نك نەبیت ژێ بدەت یان كەسەك نەبیت زڤریت بال ویڤە دا بدەتێ ، یان كەسەكی خۆە هێلابیت ب هیڤیا مالا خۆە ڤە كۆ

ئەو زەكاتێ بددەت و هەروەسا وانا ژی خۆە هێلا بیت ب هیڤییا ویڤە (ئەو زەكاتێ بدەت) ، ئەڤە دێ زەكاتێ دەت كا كەنگی ئەو بۆ وی یا ب ساناهیی بیت ، خۆ ئەگەر پشتی جەژنێ ژی بیت ، چنكو ئەو یێ خودان عوزرە .







9. هندەك خەلك پیرۆز باهیێ ل هندەكا دكەن ، بەلێ پا هندەك ژ تشتێ حەرام دڤێ چەندێ دا رۆیددەن ئەڤا كۆ ل نك گەلەك خەلكی رۆیددەن ، دەمێ كۆ زەلام دچن د مالأن ڤە دچنە دەستێ ژنێن بێ ستار بییێ ئامادە بوونا مەحرەمان [6] ، و ئەڤ چەندا هەنێ خرابینە ، هندەك ژ وان ل سەر هندەكانە .

و د بینین هندەك خەلك درەڤن ژ وان كەسێن رێگریا خەلكی دەكەن ژ چوونا دەستی وان یێن نە مەحرەم بۆ وی ، ئەو خەلكە زوردارن نە ئەو زوردارە [7]

و برِینا مروڤانیێ ژ وانایيە نە ژ وی یە ، بەلێ ل سەر وی پێدڤی یە بۆ وانا دیار بكەت و بەرێ وانا بدەت بۆ پرسیار كرنا كەسێن جهێ باوەرییێ ژ زانایان دا كۆ خۆجە ببن و گومان نەمینیت ، و هەروەسا نیشا وان بدەت كۆ ئەو تۆرەنەبن تنێ ب ئەگەرێ دیڤ چوونا عەدەتێن باب و باپیران ، چنكو ئەو(عەدەتە) حەرامی حەلال ناكەن و

---

6 : مەحرەم ئەو كەسەنە ئەوێن نێزیكی وێ كۆ حەرامە ئەو شویی ب وان بكەت وەكی بابی و برایی .....

7 : ئەو خەلكێ ژ وی درەڤن زوردارن ئەو نە زوردارە ئەو كەسێ دبێژیت نەچنە دەستێ وان ژنێن بۆ هەوە نەحەلال .

هەروەسا حەلالی ژی حەرام ناکەن ، و بۆ وانا دیار بکە ئەگەر وانا ئەڤ تشتە کر ئەو دێ وەکی وان بن ئەوێن خودێ گوتنێن وان بەحسێ وانا کری

{وَكَذَلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلاَّ قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآءَابَآءَنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىءَاثَارِهِم مُّقْتَدُونَ}( سورة الزخرف 23) .

ڕامان (( و ئاها بڤی ڕەنگی بەری تە بۆ چ گوندا پێغەمبەرەك مە نە هنارتیە وانا ژ سزایێ مە بترسینیت ، ئیللا ئەوێن دەست هەلادار و زەنگینان دگوتن مە باب و باپیرێن خۆە ل سەر دینەکی و عیبادەتەکی دیتبین و ئەم ژی دێ ل دیڤ وان چین و چاڤ ل وان کەین)).

و هندەك خەلکی بخۆە یێن کرین عەدەت دەرکەڤن بچن بۆ گۆرستانێ ل ڕۆژا جەژنێ دا و پیرۆز باهیێ ل خودانێن قەبرا (مری یا ) بکەن ، و مریان چ پێتڤی ب پیرۆز باهیێ نینە ، نە ئەو ب ڕۆژی بین و نە وانا نڤێژێن شەڤێ(تەراویح) دکرن.

سەرەدانا گورستانێ نە تایبەت کری یە ب ڕۆژا جەژنێ ڤە ، یان ب ڕۆژا ئەینیێ ڤە ، یان هەر ڕۆژەکا دی یا هەبیت ، بێ گومان یا ژ پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم)

خۆجە بی کۆ سەرەدانا گورستانێ یا کری د شەڤێ دا ، هەر وەکی د حەدیسا عایشایێ ( خودێ ژێ رازی بیت) د صەحیحا موسلم دا هاتی «زوروا القبور فإنها تذكركم الآخرة» ئانکو (( سەرەدانا گۆرستانان بکەن چنکو ئەو دێ بیرا هەوە و ئاخرەتێ ئینیت )).

خۆە ئەگەر هندەکا (ئەڤ چەندە) یێ گرێ دا ب وێ چەندێ ڤە یێ دلێ وی ڕەق بیت و نەیێ دویر بیت ، چنکو پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) ئەگەرێ ئەمر کرنا چوونا سەر گۆرستانان کر بیر ئینان بۆ ئاخرەتێ ، ڤێجا هەر گاڤەکا ئەم ل ئاخرەتێ دویر کەتین دا چین سەر گۆرستانان ، بەلێ پا ئەز نزانم کێ ئەڤ چەندە گوتی یە ژ زانایان ، ئەگەر گوت بن ژی دا بۆ چەند روویی و شێواز هەبن.

سەرەدانا گۆرستان ژ عیبادەتانە ، و عەدەت دروست نابیت هەتا ل گەل شەریعەتی

ب گونجیت د شەش كاران دا ژوانا دەم ، تایبەت نەكری یە پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله علیه وسلم) سەرەدانا گۆرستانان د ڕۆژا جەژنێ دا ، ڤێجا نە یا پێدڤی یە تایبەت بكەی ب ڕۆژا جەژنێ ڤە .

10. ئەو تشتێ ل ڕۆژا جەژنێ دا دهێت كرن چوونا سەر و ستوییێ زەلامان ، هندەك ژ وان دچنە سەرو ستوییێ هندەكان ، ئەڤە چ تێدا نینە ، و ماچیكرنا وان ژنێن مەحرەم[8] ژی چ تێدا نینە ، بەلێ پا زانایان ئەو یا مەكروه[9] كری ئیللا د دەیكێ دا نەبیت زەلام سەرێ وێ یان ئەنیا وێ ماچی بكەت و هەروەسا بۆ كچێ ژی ، ژبلی دەیكێ و كچێ ژ مەحرەمان و خۆە دویر بكەن ژ ماچی كرنا هەردوو ئالەكان ، ئەڤ چەندە یا ب سلامەت ترە.

8 : ئەوێن بۆ مروڤی حەلال وەكی دەیك و ژن و كچا مرڤی...

9 : مەكروه : ئەوە ئەگەر تو وی تشتی نەكەی باشترە لێ ئەگەر تە كر چ ل سەر تە نینە

11. و یا هاتی دانان بۆ وی كەسێ دەردكەفیت بۆ نڤێژا جەژنێ ئەو د رێكەكێ را دەركەفیت و درێكەكا دیترا بزڤریت وەكی چاڤ لێكرنەكێ یە بۆ پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) و نابیتە سونەت ئەڤ سونەتە ل غەیری وێ ژ نڤێژان [10] ، نە ل نڤێژا ئەینیێ و نە ل غەیری نڤێژا ئەینیێ ، بەلكی یا تایبەت كری یە ب جەژنێ ڤە ، و هندەك ژ زانایان ئەڤێ چەنداهەنێ دبینن دروست د نڤێژا ئەینیێ ، بەلێ پا یاسا و بنیات (ئەڤەیە) : «أن كل فعل وجد سببه في عهد النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ولم يفعله فاتخاذه عبادة يكون بدعة من البدع»

ئانكو :((هەر كارەكێ ئەگەرێ وێ هاتبیتە دیتن و زانین ل سەر دەمێ پێغەمبەری دا (صلى الله عليه وسلم) و وی نەكر بیت ، ڤێجا گرتن و كرنا وێ بخۆە بكەنە عیبادەت (ئەڤ چەندە) دبیت بیدعەك ژ بیدعان [11] )) .

---

10 : ئەڤ سونەتە بەس بۆ نڤێژا جەژنێ یە نە بۆ نڤێژێن دیترە.

11 : بیدعە: هەر تشتێ نوی دەركەتی بدەنە پال دینی ڤە و چ دەلیل و بەلگێن شەرعی ل سەر نەبن دێ كرنا وێ بیتە بیدعە .

ئەگەر هاتە گوتنێ : حیكمەت و ئەگەر چی یە ژ گهورینا رێكێ ؟

بەرسڤ/ چاڤ لێكرنەكە بۆ پێغەمبەرێ خودێ (صلی الله علیه وسلم) {وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلاَ مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالاً مُّبِيناً} (سورةالأحزاب 36)

ڕامان (( بۆ چ باوەردارێن زەلام و ژن حەلال نی نە ، دەمێ خودێ و پێغەمبەرێ وی (صلی الله علیه وسلم) بریارەكێ بدەن ئەو بكەیفا خۆە بن ب خۆە تشتەكێ دی هەلبژێرن ، و هەر كەسەكێ بێ ئەمرییا خودێ و پێغەمبەرێ وی (صلی الله علیه وسلم) بكەت ، ئەو یێ ب سەردا چووی ب سەرداچوو نەكا دیار و ئاشكرا)).

دەمێ پرسیار ژ عایشایێ(خودێ ژێ رازی بیت) هاتیە كرن : بۆچی ژنێن دحەیزێ دا ڕۆژیێن خۆە قەزا دكەن ئەوێن ژێ چووین ل دەمێ بێ نڤێژیێ دا و نڤێژێن خۆە قەزا ناكەن ؟ عایشایێ(خودێ ژێ رازی بیت) گوت «كان یصیبنا ذلك فنؤمر بقضاء الصوم، ولا نؤمر بقضاء الصلاة»

ئانكو :(( دا ئەم توشی ڤێ چەنداهەنێ بین( دا كەفین د حەیزێ دا) دا فەر مان ل مە هێت كرنێ ب قەزا كرنا ڕۆژی یا ، و فەرمان ل مە نەد هاتە كرنێ ب قەزا كرنا نڤێژا))، ئاها ئەڤە حیكمەتە.

و هندەك زانایان ئەگەرا وێ كر بۆ دیار كرنا ئەڤێ دروشمی د سیكێن موسلمانادا.

و هندەك زانایان ئەگەرا وێ كر ژبەر هندێ كۆ هەردوو رێك بۆ وی ببن شاهد ل ڕۆژا قیامەتێ .

و هندەك ژ وان گوتن ژبەر كۆ دا خێر و صەدەقا سەر فەقیرو هەژاران بلاڤ كەت د رێكا دووێ دا . خودێ پتر دزانیت .

پرسیار ل شێخێ بەرێز هات کرنێ : حوکمێ نڤێژا جەژنێ چی یە؟ و شێوازێ کرنا وێ چەوانە؟ و هەروەسا مەرج و دەمێ وێ کەنگی ییە ؟

شێخێ بەرێز ب ڤێ گوتنا خۆە بەرسڤ دا / گوتنا ڕاست و دڕوست ژ گوتنێن زانایان(ئەوە) کۆ نڤێژا جەژنێ فەرزو عەینە ل سەر زەلامان ، چنکو پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) فەرمان پێ کر و پێ بەردەوام بی ل سەر کرنا وێ ، هەتا فەرمان ل وان کچێن بالغ ئەوێن ب ستارە د مال دا دکرن و فەرمان ل ژنێن د حەیزا دا دکرن کۆ دەرکەڤن بۆ نڤێژا جەژنێ و فەرمان ل وان ژنێن د حەیزا دا کۆ ئەو خۆە ڤەدەرکەن ژ جهێ نڤێژێ ، و ئەگەر ژ دەست مروڤی چوو ئەو وێ قەزا ناکەت چنکو ئەو نڤێژەك خودان کومکەرە [12] .

ڤێجا ئەگەر ژ دەست چوو ناهێت قەزا کرنێ نە وەکی نڤێژا جەژنێ یە ئەگەر ژ دەست چوو ناهێت قەزا کرن ، بەلێ پا نڤێژا ئەینیێ یا ل دەمێ نیڤرۆ دا ڤێجا دەمێ نڤێژا ئەینیێ ژ دەست مروڤی دچیت داخاز ژ مروڤی تێت کرنێ ئەو نڤێژا نیڤرۆ بکەت . بەلێ نڤێژا جەژنێ د دەمێ وێ دا چ نڤێژێن دیتر نینن

---

12 : موسلمان هەمی کوم دبن بۆ کرناوێ یان ب ڕامانا هندێ کۆ ئەو بتنێ بجەماعەت تێت کرنێ.

ژبلی نڤێژا جەژنێ ، ئەگەر ژ دەست مروڤی چوو ناهێتە قەزا كرن ، و چ پێ گوهۆرك (بدل) نین پێش ویڤە بكەی .

بەلێ یا دڕوست تێدا : چەوانی یا وێ دێ تەكبیرا ئیحرامێ كەت(الله أكبر ا دەست پێكێ دەمێ دچی دنڤێژێ دا ) ، و دێ داخازێ كەت و نڤێژێ پێ ڤەكەت ، پاشی دێ شەش تەكبیراتێن دیتر دەت ، پاشی دێ سورەتا فاتیحێ خوینیت و ل گەل وێ سورەتا (سبح) یان سورەتا (ق) د ركعەتا ئێكێ دا ، و دركعەتا دووێ دا ئەگەر ژ سوجدێ رابی دێ رابیت بێژیت الله أكبر ، وپاشی دێ پێنج تەكبیراتێن دیتر دەت پشتی رابینا وی ، وپاشی دێ سورەتا فاتیحێ و سورەتەك دی خوینیت ، ڤێجا ئەگەر دركعەتا ئێكێ دا سورەتا(سبح) خواند و د یا دووێ دا سورەتا «الغاشية» ، و ئەگەر د یا ئێكێ دا سورەتا (ق) بخونیت و ل یا دووێ دا سورەتا «اقتربت الساعة وانشق القمر» بخونیت .



حەحد و سوپاسی بۆ خودێ بیت كۆ وی هێز و شیان دایی مە بۆ تمام كرنا ڤێ ناما پر ب مفا ، دوعا ژ خودێ دكم مە شارەزا بكەت د دینێ خۆە دا و بەردەوامیێ بدەتە مە ل سەر رێك و رێبازا ڕاست و دڕوست هەتا مرن ب سەرمەدا بهێت و ئەم ل سەر وێ رێك و رێبازێ بین .

وصلَّى الله وسلَّم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

ب دویماهیك هات : ل ئێڤارا ئێك شەمبێ

ب وەرگێرانا برایێ هەوە : هوار بەرواری

ل 17 رەمەزانێ

ل سالا 1441ھ